لەبڵاوكراوەكانی مەكتەبی ڕاگەیاندنی
كۆمەڵی ئیسلامی لەكوردستان/ عێراق
ژمارە (١)

# هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكیدا
# و
# چەند ئامۆژگاری‌یەك بۆ ئەندام
# و
# موجاهیدانی كۆمەڵی ئیسلامیی

عەلی باپیر



١٤٢٢ك ٢٠٠١ز

لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕاگەیاندنی

کۆمەڵی ئیسلامی لەکوردستان / عێراق

ژمارە (١)

# هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکیدا

# و

## چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام

## و

## موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامیی

عەلی باپیر

١٤٢٢ك ٢٠٠١ز

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

(وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً) النساء :١٢٥.

## پێشکەش بێ

بەو ئەندامو موجاهیدە دڵسۆزانەی کۆمەڵی ئیسلامیی کە چ لەبواری هەڵس‌وکەوت‌و ڕەفتارو، چ لەبواری جەنگ‌و بەرەنگاریدا ئیسلام‌و مسوڵمانان پێیان سەربڵندن‌و، نە لەتەنگانەو فەڕحانیدا سنوورەکانی شەرع دەبەزێنن‌و، نە لەحاڵەتی پێخۆشبوون‌و پێناخۆشبوونیشدا فەرمانی سەرووی خۆیان دەشکێنن.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## وتەیەک

سەرەڕای خۆشحاڵیمان لەهەموو هەنگاو و دەستبارێکمان بۆ مەتین و تۆکمەکردنی تەبلیغاتی ئیسلامیی، کە بە هۆکارێکی گرنگ و لەبەرچاوی دەزانین بۆ ناساندن و پێگەیاندنی گوتارو لێکدانەوەی تەواوی چەمکەکان؛ لەگەڵ ئەوەشدا وەك مەکتەبی ڕاگەیاندن، بەجێگەی خۆی دەزانین کە بەرهەمێکی جەنابی مامۆستا عەلی باپیر دەکەینە بەرکوڵی بەرهەمەکانمان.

ئەم شێوە ئاراستەو چەمکە بڵندانە لەوە زیاتر هەڵدەگرن، کە لەم پێشەکی یە کورتەدا لەناوەرۆکەکەی بدوێین، ئەوە بۆ خوێنەرە خاوەن فام و سەلیقەکان جێدەهێڵن.

تەنها ئەوەندە دەڵێین برایانی موجاهیدو پێشمەرگە دلێرەکانمان ئەو دەروازەن کەسەرجەم توێژەکانی کۆمەڵ لێیەوە هەڵماندەسەنگێنن و هەڵوەستە دەکەن؛ بەو حوکمە، دەبێت نمونەی ئاکاری بەرزو سلووکی خاوێن بن بۆ جوانترکردن و بەرز ڕاگرتنی درووشم و پرەنسیپەکانی (کۆمەڵی ئیسلامیی)و ببێتە هۆیەکیش بۆ ئاوێتەبوونمان بەخەڵك و ئاوێتە بوونیشمان بەسەرجەم چینەکانی کوردەواریی، کە دەکرێت بەردێکی ئەو بنچینەیە بێت کە پێکهاتەی کلتووری نەتەوەییمانی لەسەر بنیات دەنرێت.

کەواتە ئەو حەقە بەخۆمان دەدەین کەداوا لەسەرجەم پێشمەرگە نەبەزەکانی کۆمەڵ و هەموو ئەوانەش خۆیان بەنوێنەرو مشوورخۆری ئیسلام و کۆمەڵ دەزانن دەکەین پابەندبن بەم ئامۆژگاریو ڕێنماییو ئاراستانەوە، بەهیوای بنیاتنانی کۆمەڵێکی ئیسلامپەروەر، خواش پشتیوانی گشت لایەك بێت.

مەکتەبی ڕاگەیاندنی

(کۆمەڵی ئیسلامیی لەکوردستان/ عێراق)

# ئەم نامیلکەیە

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت دەقی ئەو وتارەیە کەبەندە لەئێوارەی ڕۆژی: (١٣ی ربیع الأول/ ١٤٢٢)کۆچی، بەرانبەر بە (٢٠٠١/٦/٥)زایینی، ئاراستەی ژمارەیەکی زۆر لەئەندامان و پێشمەرگە دڵسۆزو فیداکارەکانی (کۆمەڵی ئیسلامیی)م کرد لەبارەگای تایبەتی خۆم لە (ئەحمەداوا).

پاشان برایەکی بەڕێزی ڕاگەیاندن کاک (ڕزگار عبدالله) لەکاسێتەوە دایڕشتۆتەوە بەنووسین و دواتریش برای بەڕێزم کاک (محەممەد سەنگاوی) بەمەبەستی (تخریج) کردنی هەندێك لەفەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەوتارەکەدا هاتبوون و (تخریج) نەکرابوون، یان بەتەواوی (تخریج) نەکرابوون پێیدا چۆوەو، دواتر خۆیشم بەپەلە چاوێکم پێدا خشاندەوە.

جا زۆر سوپاسی کاك (ڕزگار عبدالله) و مامۆستا (محەممەد سەنگاوی) دەکەمو خوا پاداشتیان بداتەوەو، هیواداریشم سەرجەم ئەندامان و موجاهیدانی (جەماعەت) مان بەوردی ئەم ئامۆژگارییانە بخوێننەوەو جێبەجێی بکەن، خوا بکات بەهەموو لایەکمان و بەوردو درشتی جەماعەتی ئیسلامیمانەوە بتوانین کارێك بکەین لەبواری هەڵسوکەوت و ڕەفتارو ئاکار لەگەڵ دەوروبەرو کۆمەڵگامان دا، کە بەهیچ جۆرێك هیچ کەسێك نەتوانێ ڕەخنەو گلەیی شەرعیی لێمان هەبێت و، بێگومان لە ڕەخنەو گازندەو پڕوپاگەندەی ناشەرعییانەو غەرەزاوییش بێباکین، چونکە هیچ کەس ناتوانێ لەوە سەلامەت بێت.

ئاشكراشه كه بەئەندازەی پابەندییمان بەقورئان و سوننەتەوەو مل کەچیمان بۆ بڕیارەکانی شەرع و ڕاست و ساغبوونمان لەگەڵ خوادا، دەتوانین خۆمان لەخووخدە پیس و بەدەکان بژار بکەین و بەڕەوشت و ئەدەب و ئاکارە بەرز و پەسەندەکان برازێنینەوە، بەکورتی:

لەگەڵ خەڵکی چاك بوون بەرهەمو زادەی لەگەڵ خوادا ڕاست و ساغ بوونە، هەربۆیەش (عبدالقادر)ی گەیلانی ڕەحمەتی خوای لێبێ دینداریی و مسوڵمانێتی لەدوو وشەدا کورت کردۆتەوەو گوتوویەتی: (صِدْقٌ مع الحَقّ وخُلُقٌ مع الخَلْق).

پێم وایە شێخ (عەبدولقادر)یش ئەو قسەیەی لەم ئایەتە بەهێز و پێزەو هاو وێنەکانی هەڵهێنجاوە، کە دەفەرموێ:

(وَمَنْ أحْسَنُ دِينًا مِمَّنْ أسْلَمَ وَجْهَهُ لِلّٰهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ...) النساء: ١٢٥.

ساخوایە بەلوتفی خۆت هیدایەتمان بدە کە بەهۆی ئیخلاص و گەردن کەچیمان بۆ خۆت و چاکەکاریی و خۆشڕەفتاریمان لەگەڵ بەندەکانتدا ببینە خاوەنی چاکترین جۆری دینداری‌کردن (أحْسن ديناً)و بەوهۆیەشەوە سەر بەرز و بەختەوەری دنیاو دواڕۆژمان بکە.

جومعه/ ٨ی ربیع الثاني ١٤٢٢

٢٠٠١/٦/٢٩

ئەحمەدئاوا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدالله، نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذُ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهدِهِ الله فلا مُضِلٌّ لَهُ ومن يُضلِل فلا هادي له وأشهدُ أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمداً عبدهُ ورسولهُ صَلَوات اللهِ وسلامه عليه وعلى آلهِ وصحبهِ ومَنِ آهتدى بهديهِ.

ئەندامانی بەڕێزو خۆشەویست، برایانی موجاهید، پێشمەرگە دڵسۆزەکانی ئیسلام...

بەپێویستم زانی لەم قۆناغە ناسکەدا لەژێر سەردێری (چەند ئامۆژگارییەك بۆ براو موجاهیدەکانمان لەبواری هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا) چەند شتێکتان بۆ بخەمەڕوو کەهیوادارم بەگوێ بیان بیستن، بەدڵ وەریان بگرن، وەپاشان پیادەیان بکەنو ڕەفتاریان پێبکەن.

جارێ لای هەموو لایەك ئاشکرایە دوای ئیمانو عەقیدەو عیبادەت خووڕەوشتی جوانو ئەدەبی بەرز بۆ تاكو بۆ کۆمەڵ بۆ ئینسان وەك خۆی، بۆ کۆمەڵو میللەتی مسوڵمان دیارترینو زەقترین سیماو نیشانەیە، لەدوای ئیمانو عەقیدەو عیبادەت ڕەوشتی جوان، ئەدەبی بەرز دیارترین سیماو نیشانەی ئینسانو کۆمەڵی مسوڵمانە، خوای پەروەردگار لەگەڵێك شوێنی قورئاندا ئەو حەقیقەتەی خستۆتەڕوو، هەروەها پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ لەفەرمایشتە بەرزو پیرۆزەکانیدا ئاماژەی پێکردوە، بۆ وێنە خوای پەروەردگار کاتێك مەدحی پێغەمبەری خۆی کردوە ﷺ واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا، پێغەمبەری نەخوێندەوار، خاتەمی پێغەمبەران، دیارە پێغەمبەر ﷺ لەهەموو شتێکدا

لە لووتکەدا بوە، لە عیلم و زانست دا، لەعیبادەت دا، لەدادگەریدا، لەڕەوشت بەرزیدا، لەئازایەتیدا.. هتد، لەهەموو شتێکدا پێغەمبەر ﷺ تەواوی کردوەو گەیشتۆتە لووتکە، بەڵام خوای پەروەردگار بەڕەوشتی مەزن مەدح و وەصفی پێغەمبەر دەکات ﷺ لەبەرامبەر پروپاگەندەی دوژمنان و ناحەزانیدا دەفەرموێ کە: ( ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ، مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ، وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ، وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ) القلم: ١-٤ ،

کاتێك دوژمن و ناحەزەکانی پێغەمبەر ﷺ تۆمەتی شێتی و جادووگەرییان دەدایە پاڵی، خوای پەروەردگار لەبەرامبەر ئەوەدا دەفەرموێ: (وإنَّكَ لعلىٰ خُلُقٍ عَظيم) واتە (تۆ لەسەر ڕەوشتێکی زۆر مەزنی) ڕەوشت مەزنی و ڕەوشت بەرزیی پێغەمبەر ﷺ خوای پەروەردگار دەیکاتە بەڵگە لەسەر بێبناغەیی و بێبنچینەیی تۆمەت و پروپاگەندەی دوژمن و ناحەزانی، ئەمەش لەبەرئەوەیە کەزۆر کەس دەتوانێ (عالم) بێت، ڕەنگە بتوانێ (عابد)بێت، بتوانێ (ئازا) بێت، بەڵام بەڕاستی تەنها بۆ خوا سوڵحاوان و لەگەڵ خوادا ڕاستان دەتوانن خاوەنی ڕەوشتی بەرز بن، خاوەنی ئەدەبی بەرز بن.

لە عائیشەوە گێردراوەتەوە (خوا لێی رازی بێت) کاتێك کەپرسیاری لێکراوە دەربارەی ڕەوشت و خووی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما كانَ أحَدٌ أحسنَ خُلُقاً من رسول الله ﷺ) رواه مسلم، عائیشەی دایکی موسوڵمانان کە خێزانی پێغەمبەر بووە (عليه الصلاة والسلام) و بەوهۆیەوە پێغەمبەری ﷺ باش ناسیوە، کاتێك کەپرسیاری لێکراوە کە ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) چۆن بووە؟ فەرموویەتی: (هیچ کەس ڕەوشتی لەڕەوشتی پێغەمبەر بەرزترو جوانتر نەبووە)

له وتەیەکیتردا عائیشە فەرمویەتی: (كـان أحسَنَ الناسِ خُلقاً كـانَ خُلُقُهُ القُرآن يَرْضى لِرِضاهُ ويَغضَبُ لِغَضَبِه لَمْ يَكُنْ فاحِشاً ولا مُتَفاحِشاً ولا سَـخاباً في الأسواق ولا يُجزِيُ بِالسيئةِ السَّيئة ولكِنْ يَعفُوا ويَصفَح) رواه مسلم.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمویەتی: (پێغەمبەر ﷺ لەهەموو کەس ڕەوشتی جوانتر بووە، ڕەوشتی پێغەمبەر قورئان بووە (واتە قورئان چی دەفەرموێ پێغەمبەریش وا بووە)، قورئان بەچی ڕازی دەبێ، ئەویش بەوە ڕازی دەبوو، قورئان لەچی توورەدەبێ، ئەویش لەوە توورە دەبوو، قسەی ناقۆڵاو ڕەوشتی ناجۆری نەبوو، لەبازاڕ دەنگی بەرز نەدەکردەوەو قاڵەقاڵ و گاڵەی نەدەکرد، وە لەبەرامبەر خراپەدا خراپەی نەدەکرد بەڵکو چاکەی دەکردو لێبوردن و چاوپۆشی دەکرد)[1]

دوایی عائیشە (خوا لێی‌ڕازی بێت) بەو کابرایە ( کە گوتی: ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو) فەرموی: سورەتی (المؤمنون) بخوێنەوە لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئایەتی دەیەم کە ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ بەوشێوەیە بوو.

هەروەها خوای پەروەردگار لەکۆتایی سورەتی (الفرقان) کە باسی عەبدە هەڵبژاردەکانی خۆی دەکات دەفەرموێ: (وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا) الفرقان: ٦٣، لێرەدا خوای باڵا دەست بەچەند صیفاتێك وەصفی عەبدە هەڵبژاردەکانی خۆی دەکات، بۆیە پێویستە ئێمەش کە لەو ئایەتانە ڕابمێنین.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەیەوە فەرمایشتی زۆرن وەك دەفەرموێ: (إنَّما بُعثتُ لأُتَممَ صالحَ الأخلاق) رواه احمد والبخاري في الأدب المفرد وابن ابي شيبة -

---

[1] چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ (إدفع بالَّتي هيَ أحسَن) فصلت: ٣٤.

واتە: (من بۆئەوە ڕەوانە کراوم ڕەوشتی بەرز تەواو بکەم) واتە گەورەترین مەبەستی نێردرانی من ئەوەیە کە ڕەوشتە بەرزەکان لەخۆمدا تەواو بکەمو بیاندرەوشێنمەوە.

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (البِرُّ حُسْنُ الخُلُقِ) رواه مسلم.

واتە: (چاکەکاری بریتیە لەڕەوشتی جوان)، دیسان لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (إن خيارَكُمْ أحاسِنُكُمْ أخلاقاً) رواه البخاري، واتە (باشترینتان ڕەوشت جوانترینتانە) واتە: کێ ڕەوشتی جوانتر بێت لای خوا باشترە.

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (إنَّ اللهَ رَفيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ في الأمرِ كُلِه ) متفق عليه عن عائشة (رضي الله عنها)

واتە: (خوای پەروەردگار هێدیو مەندو[1] ئارامە، وە هێدی و مەندیی و نەرم نیانی خۆش دەوێت لەهەموو شتێکدا)

ئینجا سێ بەسەرهات هەن کەڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر ﷺ دەردەخەن، با سەرنجێکی خێرایان بدەین:

١)بەسەرهاتی یەکەم لەو فەرموودەیەدایە کە (أحمد وطبراني) هێناویانە لە (ابی أمامة) وە (خوا لێیان ڕازی بێت) کە دەفەرمووێ:[2] (ڕۆژێك گەنجێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و دانیشت، گوتی (یا رسولَ الله إئْذنْ لي بالزّنا) واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێم بدە باداوێن پیسی (زینا) بکەم!) ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوەو دەڵێ ئێمە بەهاوارو توڕەییەوە

---

[1] گەر بۆ مرۆڤ بەکاربهێنرێ دەوترێت (نەرمو نیان)

[2] شێخی ئەلبانی ئەم فەرموودەیەی بە (صحيح) داناوە بەژمارە (٣٧٠) لە سلسلة الأحاديث الصحيحەدا.

گوتمان: چی دەڵێی چۆن قسەی وا نابەجێ دەکەی لەبەردەم پێغەمبەری خوادا؟! ﷺ بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بێدەنگ بن، بانگی کرد وەرە پێش و زۆر بەنەرمی پێی فەرموو: پێت خۆشە داوێنپیسی لەگەڵ دایکتدا بکرێت؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: پێت خۆشە لەگەڵ خوشکتدا بکرێت؟ گوتی نەخێر، فەرمووی: پێت خۆشە لەگەڵ پوورتدا بکرێت؟ گوتی: نەخێر، ئەوجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەڵکیش پێیان خۆش نیە داوێن پیسی لەگەڵ دایك و خوشك و پوورو خزمیاندا بکرێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستی بەسینەی گەنجەکەدا هێناو فەرمووی خوایە داوێن پیسی لەلا بوغزێنراو بکە، ئەوهورەیرە دەفەرمویێ: کاتێ ئەو گەنجە هەستا هیچ شتێکی لابوغزێنراوتر نەبوو وەك زینا لەوەو دوا!

٢)بەسەرهاتی دووەم لەو فەرمودەدا هاتوە کە (بخاری و مسلم و أصحاب السنن) گێڕاویانەتەوە لە (ابوهریرة)وە (خوا لێیان ڕازی بێت) دەڵێن: (ڕۆژێك عەرەبێکی دەشتەکی هاتە مزگەوتی پێغەمبەرو ﷺ دوو ڕکات نوێژی کردو دوایی چووە گۆشەیەکی مزگەوتەکە میزی کرد، دەڵێ ئێمە هاوارمان لێکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی لێیگەڕێن میزەکەی پێ مەبڕن، کابرا میزەکەی تەواو کرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو فەرمووی: ئێرە ماڵی خوایە بەکەڵکی میز لێکردن نایەت، فەرمانیشی بەهاوەڵان کرد کەئاوبهێنن پێیدا بکەن تا شوێنەواری میزەکە نەمێنێ.

٣) بەسەرهاتی سێیەم کە لەو فەرمودەیەدایە کە (بخاری و مسلم) لە (أنس)ەوە گێڕاویانەتەوە: (کەڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ بەڕێگایەکدا دەڕۆشت، کابرایەکی ئەعرابی توند عەباکەی ڕاکێشا بەشێوەیەکی وا کە ملیوانی عەباکەی لەملی توند بوو برینداری کرد بەتووڕەیی پێی گوت: ئەی

موحەممەد لەوماڵەی خوا پێیداوی نە ماڵی دایکتە نەماڵی باوکتە بێنە بەشم بدە، پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕی لێدایەوە فەرمووی: ڕاستە ماڵی باوكو دایکم نیە و فەرمووی بیدەنێ[٤]

کەواتە پێغەمبەر ﷺ کەپێشەوای ئێمەیە ئەوە ڕەوشتو ئاکاری بووە، ئێمەش کە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرەین ﷺ دەبێ کەم تا زۆر وەکو ئەوبین.

جا برایانی خۆشەویستم هەر بۆ ئەو مەبەستە منیش دوازدە خاڵم ئامادە کردوە کە (چۆن لەگەڵ خەڵكو دەوروبەرماندا ڕەفتار بکەین)، چونکە بێگومان لەڕابردوودا هەڵەو کەمو کووڕی زۆرمان هەبووە چ لەئاستی قیادەو چ قاعیدەشدا وە مرۆڤ تا گەورەتر بێت زیاترو چاکتر پێویستی بەئادابو خووڕەوشتی بەرزو چاك هەیە، پێش هەموو کەسێکیش بەم ئامۆژگاریانەم ڕوو لەخۆم دەکەمو پاشان برایانی قیادەو پاشانیش برا ئەندامو موجاهیدەکان ئەمەش دوازدە خاڵەکانن:



[٤] رواه البخاری (١٠/٢٤٣)و مسلم (١٠٥٧) )

## ١-قسەكردن و وتوێژ لەگەڵ خەڵكدا بەشێوەیەكی شەرعی‌یانە، وە خۆپاراستن لەهەر وشەو قسەیەكی دڵ برینداركەر و دڵ ڕوشێنەرو بێ نەزاكەت.

چەندین نەقی ئایەت و سوننەت هەن لەوبارەیەوە كە مسوڵمان دەبێ دەمی پاك بێ، گوفتار چاك و دەست پاك بێت.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: (وَقُولُوا لِلناسِ حُسْناً...) البقرة: ٨٣، واتە: (قسەی جوان و چاك لەگەڵ خەڵكی بڵێن و بكەن)، هەروەها پەروەردگار بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلْإِنسَانِ عَدُوًّا مُبِينًا) الأسراء: ٥٣.

واتە: (ئەی موحەممەد! بە عەبدەكانی من بڵێ كام قسەو وشە چاكە ئەوە بڵێن (كام تەعبیر جوانە ئەوەیان بەكاربهێن) چونكە شەیطان نێوانی مسوڵمانان تێكدەدات)، هەندێجار وشەیەكی دڵ برینداركەر دەبێتە هۆی ئەوەی كەنێوان دوو مسوڵمان تێك بدات، كەواتە لەجێی ئەو وشەیە وشەیەكی تر بەكاربهێنە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەرمودەیەكیدا دەفەرموێ: (مَنْ كانَ يُؤمِنُ باللهِ واليومِ الآخر فليقل خيراً أو لِيَصْمُت) متفق عليه.

واتە: (هەركەس بڕوای بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە ئەگەر چاكە دەزانێ بابیڵێ ئەگەرنا با بێدەنگ بێت)

كوردەواری خۆشمان دەڵێن: (ئەگەر قسەكردن زیو بێت، قسە نەكردن زێڕە)، واتە مرۆڤ زیاتر لەقسە نەكردندا سەلامەتە، ئەمەش بەو واتایە نا كە حەق نەڵێت، بەڵكو با لەسەر قسەنەكردن خۆی ڕابهێنێت،

سەلەفی ساڵح (خوا لێیان ڕازی بێت) قسەکردنیان کەم بووە، لەیەکێك لەزانایانیان پرسیوە بۆ ئەوەندە کەم دەدوێی؟ لەوەڵامدا فەرموویەتی: هەرکەسێك قسەکانی لە لیستی کردەوەکانیدا لەقەڵەم بدات کەم دەدوێ، زاناو پێشەوای وا هەبووە کە پرسیاری لێکراوە درەنگ وەڵامی داوەتەوە، کەلێیان پرسیوە بۆ درەنگ وەڵام دەدیتەوە؟ گوتویەتی: هەر پرسیارێکم لێبکرێ پێش ئەوەی قسە بکەمو وەڵامەکەی بدەمەوە، وەڵامەکەی بۆ قیامەت ئامادە دەکەم کە ئەگەر خوای پەروەردگار لێی‌پرسیم ئەو قسەیەت بۆ کرد؟ وەڵامم پێ‌بێ‌و نیەتی وەڵامدانەوەم پێ‌بێ ئەوجار دەیڵێم، وە خوای پەروەردگار دەربارەی وتووێژ لەگەڵ خەڵك دا دەفەرموێ: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) النحل: ١٢٥.

واتە: (بەژیری‌و لێزانی خەڵك بانگ بکەن بۆلای خوا وە بەئامۆژگاری چاكو بە ووتووێژکردن بەباشترین شێوە° لەهەموو ڕویەکەوە).



° واتە هەم لەڕووی وشەو تەعبیری بەنەزاکەتەوەو، هەم لەڕووی بەڵگەی بەهێز هێنانەوەوەو، هەم لەڕووی نەرمو نیانیو، هەم لەڕووی چاوپۆشی لەهەڵەو پەڵەی بەرانبەرو... هتدەوە.

## ٢-چۆنیەتی ڕەفتارکردنمان لەکۆڕو مەجلیسدا:

خوای پەروەردگار دەربارەی عەبدە هەڵبژاردەکانی (عِبادُ الرَّحمـان) دەفەرمویٚ: (وَالَّذِينَ لا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا) الفرقان: ٧٢، واتە: (عەبدە هەڵبژاردەکانی خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەن کەئامادەی مەجلیسێك نابن، ناشەرعی تێدا بکرێت، وە ئەگەر بەلای قسەو ڕەفتاری پووچدا تێپەڕین بەرێزەوە تێدەپەڕن) واتە حورمەت و ڕێزی خۆیان لەوە ناوەشێننەوە کە بەشداری قسەو شتی پووچ بکەن..

وە کاتێك مرۆڤ دەچێتە مەجلێسکەوە دەبێت سەلام بکات وە کاتێك ڕۆیشت سەلام بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەی (صحیح)دا فەرموویەتی: (سەلام کردنی یەکەم لەپێشتر نییە لەسەلامی دووەم)[٦]

ئەمەش[٧] واتە: ئەی مەجلیس من سەلامەتیم پێیە بۆ ئێوە وەسەلامەتیشتان بۆ جێدەهێڵم، وە کاتێك پێغەمبەر ﷺ کە چۆتە مەجلیسێکەوە لەکوێ چۆڵ بووبێ لەوێدا دانیشتوە، وەیەکێك لە ئادابەکانیتری کۆڕو مەجلیس قسە نەبڕینە بەخەڵك جگە لەکاتی قسەکردنی هەڵەو تاواندا چونکە ئەوە ڕێگرییە لەناشەرعیی (نهي عن المنكر) وە دەنگ بەرز نەکردنەوەو گاڵەو قرەکردن بەسەر مەجلیسدا، مەگەر لەکاتی پێویستدا دەنگ بەرز بکرێتەوە، وەنابێ لەکاتی دانیشتندا پاڵ بکەوێ یان قاچی ڕابکێشێ و پاڵبداتەوە مەگەر لەکاتی بوونی عوزردا وەك قاچ ئێشەو نەخۆشیو.. هتد.

---

[٦] رواه أبوداود (٥٢٠٨)و الترمذي (٢٧٠٧) واخرجه البخاري في الأدب المفرد (٩٨٦) وسنده حسن وصححه ابن حبان (١٩٣١)و (١٩٣٢).

[٧] واتە سەلام کردن.

## ٣-بەڕێگادا ڕۆیشتن بەسواری یان بە پیادە:

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: (وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا) الفرقان: ٦٣، واتە: (بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەن بەئارامیی بەزەویدا دەڕۆن، نەك بەفیزو کەشخەو بەشێوەیەك کەخەڵك ئازار بدەن).

با أن شاء الله هەوڵ بدەین ئەو شتانەی کە مایەی ناڕەزایی پەروەردگارن و لەمەوبەر کەم وکوڕی و هەڵەبوون نەیانکەینەوەو واقیعو وەزعێکی تر بەرجەستە بکەین. تا ئەو تێڕوانینە سەلبی یەی کەپێشتر بەرامبەرمان دروست بوو بوو نەیهێڵێین و بیسڕینەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ (وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَنْ تَخْرِقَ الْأَرْضَ وَلَنْ تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولًا) الاسراء: ٣٧، واتە: (بەفیزو کەشخە بەسەر زەویدا مەڕۆ، نە زەویت بۆ دەدڕێ، نە بەقەد شاخیش بەرزو باڵای) واتە فیز بەسەر کێدا دەکەیت؟!

وە هەروەها کەسێك کە بەڕێگادا دەڕوات دەبێ بزانێ چۆن دەڕوات بەهەمان شێوە کەسانێکیش کە لەسەر ڕێگەو بانن دەبێ مافی ئەو ڕێگاوبانە بدەن.

پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بەهاوەڵەکانی فەرموو: (لەسەر ڕێگەوبان دامەنیشن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چارمان نیە دەبێ هەر دابنیشین ئەگەر بۆ پشودانیش بێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەر ناچارن و دادەنیشن مافی ڕێگاکە بدەن، گوتیان: مافی ڕێگا چی یە؟! فەرموی: وەلامی سەلامی خەڵك بدەنەوە، چاوتان لە سەیرکردنی ناشەرعی بپارێزن و ڕێزی ڕێبواری ڕێگاکە بگرن واتە کەس تووشی زیان نەبێت بەدەستتانەوە)[٨].

---

[٨] متفق علیه. البخاری (٥/٨١) و مسلم (٢١٢١) واخرجه ابوداود (٤٨١٥)

# ٤-چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ کەسانی لەخۆ گەورەتر و لەخۆ بچوکتردا:

ئێمە تێبینیمان هەیە لەسەر زۆر برای خۆمان لەم خاڵەشدا، چونکە دەبێ بزانین چۆن ڕەفتار بکەین لەگەڵ کەسانێك کە لەخۆمان گەورەتربن لەڕووی تەمەنەوە یان بەرپرسێتییەوە یان زانستەوە، یان ڕیش سپییەك، مامۆستایەك، کەسێکی پیرو بەساڵا چوو... هتد.

وە دەبێ بشزانین چۆن ڕەفتار بکەین لەگەڵ کەسانێك کە لەخۆمان بچوکتر بن لەو بوارانەدا کەباسکران یان لەهەر ڕوویەکی ترەوە بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (مَنْ لَم يَرْحَمْ صغيرَنا ويَعرِفْ حقَ كبيرِنا فليس منا)[٩]

واتە: (هەر کەس بەزەیی بە بچوکماندا نەیەتەوەو مافی گەورەو بەتەمەنمان نەزانێ لەئێمە نییە) لێرەدا مەبەستی ئەوە نییە کە لەئیسلام بیباتە دەرەوەو بە بێباوەڕ لەقەڵەمی بدات، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە لەو مسوڵمانانە نییە کە دوای خووڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ دەکەون..

لەفەرمودەیەکی تردا دەربارەی پیاوو ئافرەتی بەتەمەنو سەر سپیو پیاوی زاناو خاوەن دەسەڵاتو فەرمانڕەوای شەرعی دەفەرموێ: (إنَّ من إجلال الله إكرام ذي الشَّيْبَة المُسْلِم وحامل القُرآنِ غير الغالي فيه والجافي عنه وإكرامِ ذي السُّلْطانِ المُقسِط)[١٠] رواه ابودلود والبيهقي والبخاري في الأدب المفرد -.

---

[٩] رواه ابوداود (٤٩٤٣) والترمذي (١٩٢١) واخرجه احمد (١٨٥/٢) وسنده حسن.

[١٠] رواه ابوداود (٤٨٤٣) وحسن سنده الحافظان العراقي وابن حجر كما قال الشيخ شعيب الأرنؤوط في تحقيقه وتخريجه على (رياض الصالحين) ص١٩١.

واتە: (لەڕێزلێگرتنو بەپایەدار زانینو خاوەن شکۆزانینی خوای پەروەردگار ئەوەیە کەڕێز لەمرۆڤی بەساڵاچو بگری)

جاری وا هەبووە پێغەمبەر ﷺ پیرەژنێك لەڕێگادا توشی بووە دەستی گرتووەو نزیکەی سەعاتێك لەگەڵیدا ڕاوەستاوە تا ئیشەکەی تەواو بووەو هاوەڵان چاوەڕێیان کردووە، چونکە دەبێ مرۆڤی بەتەمەن ڕێزی لێبگیرێ ئاخر کەسانێك بەپێی ئایینو بەرنامەی خوا ژیا بنو لەو ڕێیەدا پیربوو بنو سەریان سپی کردبێ شایستەی ڕێزلێگرتنن (وەڕێزلێگرتنی هەڵگری قورئان ((واتە ئەو کەسەی کە لەقورئان و شەریعەتی پەروەردگار شارەزایە)) زۆر تێیدا ڕۆنەچووە کە زیادەڕەوی تێدا بکاتو کەموکورتیشی تێدا نەکردووەو پابەندە بەسنورەکانی شەرعەوە، وە ڕێزلێگرتنی خاوەن دەسەڵاتێکی دادگەر).

بەم پێیە دەبێت ڕێزگرتن لەنێوان گەورەو بچوکدا هەبێتو بچوك ڕێزی گەورە بگرێو گەورەش بەزەیی بەبچووکدا بێتەوەو ڕێزیشی بگرێ.

# ٥-چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەکاتی بەرەنگاریی و ڕووبەڕووبوونەوەی نەزانین و نەفامیی کەسانی نەفام و ناکامڵدا.

خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە دەفەرمووێ: (وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا) الفرقان: ٦٣.

واتە: (عەبدە هەڵبژاردەکانی خوای بەبەزەیی ئەوانەن کاتێك نەفامەکان قسەی ناشایستەیان لەگەڵ دەکەن هەڵوێستیان ئەوەیە قسەی سەلامەتی دەکەن یاخود سەلامیان لێدەکەن و بەجێیان دێڵن و قسەیان لەگەڵ ناکەن)

وە لەسورەی القصص ئایەتی -٥٥- دەفەرمووێ: (وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ)

واتە: (کاتێك قسەی پووچ و بێمانا دەبیستن پشتی تێدەکەن و دەڵێن کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان سەلامتان لێبێ و خوا حافیز ئێمە لەگەڵ خەڵکی نەفامدا قسە ناکەین) چونکە کاتێك کەسێك قسەیەك یان هەڵوێستێك بەرامبەر بەکەسێك دەنوێنێت، ئەگەر ئەو کەسەش بینوێنێتەوە بەهەمان شێوە بکات وەك یەك وان و هیچ جیاوازییان نیەو لەتەرازوویەك دان!

وە لەسورەتی - آل عمران ئایەتی ٣٤- دا دەفەرمووێ: (والكاظمين الغَيظَ والعافينَ عَنِ النَّاسِ واللهُ يُحِبُّ المُحسنين) کە وەصفی ئەو عەبدانە دەکات کەڕقی خۆیان قوت دەدەنەوە، توڕەیی خۆیان کپ دەکەنەوە، وە لەخەڵك

دەبـورن و چاوپۆشـییان لـێدەکەن و چاکەشـیان لەگـەڵدا دەکـەن، لەئیسلامدا توڕە نەبوون (مدح) نەکراوە بەڵکو توڕەیی کپ کردنەوە (مدح) کراوە، مسـوڵمان دەبـێ توڕەیـی هـەبێ لـەکاتی خۆیدا، چونکە تووڕەبوون نیشانەی هەبوونی شەهامەت و غیرەت و عیززەتە بەلام دەبێ بتوانێ زاڵ بێت بەسەرتوڕەییەکەدا، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لَيسَ الشَّدِيدُ بالصُّرعَةِ إنَّما الشديدُ الذي يملكُ نفسه عندَ الغضبِ) متفق عليه عن ابي هريرة، واتە: (پاڵەوانیی خەڵك لەزەویدەر نیـە بەڵکو ئازاو بەهێز ئەو کەسەیە کە لەکاتی توڕەییدا زاڵە بەسەر کپکردنەوەی توڕەیەکەیدا).

پێغەمبەر ﷺ بەبێ هۆ تووڕە نەدەبوو بـەلام لـەکاتی پێویستدا وەك ئەوەی کەسێك ناشەرعییەکی بکردایە تووڕە دەبوو جاری وا هـەبووە هێنـدە تـووڕە بـووە کـە ڕووی سـوور هەڵگـەڕاوەو دەمـاری پـیرۆزی ملی دەرکەوتوە.

ئیمامی شافیعی (ڕەزای خوای لێبێ) لەبارەی تووڕەبوونەوە گوتویەتی: (مَـن اسْـتُغضِبَ ولَـمْ يغضَـبْ فَـهُوَ حِمَـارٌ، ومَـنِ اسْـتُرضِيَ ولَمْ يَرْضَ فَهو شيطان)

واتە: (هەر کەسێك توڕە بکرێ و توڕە نەبێ ئەوە گوێدرێژە، وەهەر کەس ڕازی بکرێ و عوزری بۆ بهێنرێتەوە ڕازی نەبێ ئەوە شەیطانە)

بەم پێیە مسوڵمان دەبێ توڕەیی هەبێ بۆ کاتی خۆی بەلام توڕەییەك کە لەسنوری شەرع دەرنەچێت.

# ٦-ڕێزگرتن لەمیوان و لە ڕێبوار:

پێغەمبەر ﷺ ڕێزی میوانی گرتووە وەك دەفەرمووێ: (مَنْ كـانَ يُؤمِـنُ باللهِ واليومِ الآخرِ فليُكرِم ضَيْفَهُ)[11] (هەرکەسێك بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی میوانی خۆی بگرێت) میوان مسولمان بێ یان کافر، ئیسلامی یان عەلمانی دەبێ ڕێزی لێبگیرێ.

پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) ژمارەیەك میوانی دێت نازانێ کێن! دەستبەجێ بەڕێزەوە پێشوازی‌یان لێدەکات و وەریان دەگرێ و بەشێوەیەکی زۆر جوان وەڵامی سەلامەکەیان دەداتەوەو بێئەوەی ئاگاداریان بکات خواردنیان بۆ ئامادە دەکاو فەرموویان لێدەکا، هەرچۆنێك بێت ڕێزگرتن لەمیوان یەکێکە لەسیفاتی پیاو چاکان، وەك چۆن هەرکەسێك پێی خۆشە ڕێزی لێبگیرێ بەمیوانیی، بەهەمان شێوەش کەسانی بەرامبەریش حەز دەکەن ڕێزیان لێبگیرێ و بەگەرمی و حورمەتەوە وەربگیرێن.

جا برایانی سەنگینم! دەبێ تا دەتوانین کردارو ڕەوشت و گوفتارمان پاك و باش بێت ڕێز لەخەڵك بگرین چونکە خەڵکی لەو ڕوانگەیەوە سەیری ئێمە دەکەن، ڕێزگرتن لەخەڵك دەبێتە مایەی دڵخۆشی و دڵنەرم بوونیان و زیاترگوێ لەئامۆژگاری چاکە دەگرن.

یەکێك لەنیشانەکانی ڕێزگرتن لەمیوان نەچوونە سەرەوەی میوانەو پێشنەکەوتنە لەمیوان مەگەر بۆ پێشاندانی شوێنەکە بێت، وە دەبێ بەهەموو شێوەیەك ئاگامان لەهەست و نەستی میوان بێت و بەقسەو تەعبیری نەگونجاو بریندازی نەکەین.

---

[11] رواه البخاري (١٠/٣٧٣) و مسلم (٤٧).

## ٧-ڕووگەشی و زمانشیرینی و بەڕێزیی لەگەڵ خەڵکدا:

مسوڵمان ڕووگەش و زمان و گوفتار شیرینە لەگەڵ هەموو کەسێکدا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:

(لاتَحْقِرَنَّ مِنَ المعْروفِ شيْئاً وَلَوْ أنْ تَلْقَى أخاكَ بِوَجهٍ طَلْقٍ)[١٢]

واتە: (لە خێرو چاکە بەکەم مەزانە ئەگەر هەر ئەوەندەش بێت بەڕووی گەش بگەی بە برای مسوڵمانی خۆت).

مسوڵمان ئەگەر غەم و پەژارەو نارەحەتیشی هەبێت دەبێ هەوڵبدات لەنێو دڵی خۆی بێت و، لە ڕووخساردا بەرامبەر مسوڵمانان ڕووخۆش و دەم بەخەندە بێت، چونکە ئەگەر ئەو قەڵسی و پەستێیی و نارەحەتی‌یە لە ڕوخساردا دەربڕرا ئەوە لەکاتی دیدارو پێك گەیشتندا بەڕوو گرژی و ناهەمواری‌یەوە، بەرامبەرەکەی وا دەزانێ بەرامبەر بەوی‌یەو زیاتر دڵەکان لەگەڵ یەکتر سارد دەبنەوەو ئاکامی باش نابێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (والكَلِمَةُ الطَّيبةُ صَدَقَةٌ)[١٣] واتە: (قسەی چاك خێرە)، خوای پەروەردگار بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ) آل عمران: ١٥٩.

واتە: ئەی موحەممەد بەهۆی بەزەیی‌یەك لەخواوە بۆ هاوەڵەکانت نەرم بووی ئەگەر گوفتار ڕەق و دڵڕەق بوویتایە لەدەورت دەپرژان و هەریەکەیان بەلایەکدا دەچوون).

دەبا ئێمەش بەئیزنی خوا هەوڵبدەین نەرم و نیان و بەئارام بین بەتایبەتی برایان و کەسانی بەرپرس دەبێ زۆر بەوریایی پەیڕەویی لەم حاڵەتە بکەن.

---

[١٢] رواه مسلم (٢٦٢٦).

[١٣] رواه البخاري (٥/٢٢٦) و مسلم (١٠٠٧) و (١٠٠٩)

## ٨- مامەڵەکردن و کڕین و فرۆشتن:

دەبێت زۆر بەرەفتارێکی جوان مامەڵە بکەین و ستەم لەکەس نەکەین بەوەی کە بڵێین چەك و هێزمان هەیەو زوڵم و ستەم لەخەڵکی بکەین، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (رَحِمَ اللهُ عبداً سَمْحاً إذا باعَ سَمْحاً إذا اشترى سَمْحاً إذا اقتضى) رواه البخاري عن علي بن عياش.

واتە: (لێخۆشبوون و لێبوردەیی خوا بۆ عەبدێك بێت کە خاوەنی نەرم و نیانی و لێبوردنە کاتێك کە دەفرۆشێ، کاتێك کە دەکڕێ، کاتێك کە دادگایی دەکات) واتە: سەوداو مامەڵەو و چارەسەری کێشەکان بەسینگ فراوانی و لێبوردنەوە دەکات.

## ٩- سینگ فراوانی و چاوپۆشی کردن لەبەرامبەر ڕەخنەو توانج و تێبینی خەڵك دا:

بێگومان ئێمە فریشتەی بێگوناح نین و بەفری بێ پەڵەو فریشتەی بێ هەڵەنین بەڵکو کەموکوڕییمان هەیە، وەك خۆشەویستمان ﷺ فەرمویەتی: (كُلُّ بني آدم خطاءٌ وخيرُ الخطّائينَ التّوابونَ)[١٤]

واتە: هەموو ئادەمیزادەکان هەڵەکارن وەچاکترینی هەڵە کارەکان ئەوانەن دەگەڕێنەوە بۆلای خواو تۆبە دەکەن.

بەڵێ نابێ بڵێین ئێمە موهاجیرین و لەپێناوی خوادا وازمان لەزۆر شت هێناوەو ئیتر پێویستمان بەئامۆژگاریی نیەو ڕەخنەمان لێ ناگیرێ! بەڵکو دەبێ بزانین کە لەخەڵکانی تر زیاتر پێویستمان بەڕێڕوونی و

---

[١٤] رواه الترمذي وابن ماجة والحاكم عن انس.

ئامۆژگاریکردن هەیە، چونکە ئێمە وەکو بابایەکی ئیسلامی کاتێك کەهەڵەیەك دەکەین خەڵکی ناڵێ فلان کەس هەڵەی کرد بەڵکو دەڵێن ئیسلامییەك هەڵەی کردو لەسەر ئایینەکەشمان و لەسەر کۆمەڵە ئیسلامییەکەمان و سەرجەم مسوڵمانانیش دەکەوێت، بەلام بۆ خەڵکانی تری غەیری ئیسلامی وا نییە، ئیمامی عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: (رَحِمَ اللهُ امرءاً أهدىٰ إلى عُيوبي) واتە: (ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت عەیبەکانم بەدیاری بۆ دەهێنێتەوە) چونکە ئەو کەسانە دڵسۆزن کە ئەگەر عەیب هەبێت دەیخەنە بەرچاوت و پێت دەڵێن تاکو چاکیان بکەی، بەلام ئەگەر کەسانێك کە عەیبت هەیەو پێت ناڵێن ئەوە خیانەتت لێ دەکەن!! خوای پەروەردگار لەسورەتی الزُمَـرْ: ئایەتی ١٧-١٨)دا دەفەرموێ: (...فَبَشِّرْ عِبَادِي، الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُوْلَئِكَ هُمْ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ)

واتە: (مژدە بدە بەو عەبدانەم کە هەموو قسەیەك دەبیستن، بەلام چاکترینی هەڵدەبژێرن و شوێنی دەکەون ئەوانە کەسانێکن کەخوا هیدایەتی داون وە ئەوانە خاوەنی عەقڵن).

عاقڵ ئەو کەسەیە کە تەنها عەقڵی خۆی بەڕاست نازانێ، وە مرۆڤ تا ئاستی لێپرسراوێتی زیاد بکات زیاتر پێویسی بەعەقڵ و پێشنیارو ئامۆژگاریی و تێبینی و ڕەخنەی خەڵك هەیە کەدەبێ لەسنووری شەرعدا ئاراستە بکرێن، بەلام بەهەر شێوەیەك بن، پێویستە هەرلێیان وەرگرین و لە بەرامبەر بەڕەخنەو تێبینییەکانیان دا سوپاسیان بکەین.

## ١٠-خەڵك بانگكردن بۆ ئیسلامو فەرمان كردن بەچاكەو ڕێگرتن لەخراپە دەبێ لەسەر بناغەی بنەما شەرعیەكان بێ:

بەر لەهەموو شتێك دەبێ ئێمە خەڵكی بۆ ئیسلام بانگ بكەین نەك بۆ كۆمەڵی ئیسلامی! چونكە هەموو خەڵكی لەسنووری ئیسلامدا جێی دەبێتەوە بەڵام لەسنووری كۆمەڵی ئیسلامیدا جێی نابێتەوە، وەدەبێ برایەتیمان لەسەر بناغەی ئیمان بێت نەك حیزبایەتی، چونكە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ زۆر لەوە گەورەترە كە لەجوغزو بازنەی حیزبێكو كۆمەڵێكدا جێی بێتەوە؛ پاشان دەبێ فەرمان بەچاكەو ڕێگرتن لەخراپە كردنمان بەئادابی شەرعیەوەو لەسەر بناغەی شەرع بێت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (مَنْ رَأى مِنكُمْ مُنكَراً فَلْيُغيرْهُ بِيَدِهِ فَانْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسانِهِ فَانْ لَمْ يَسْتطعْ فَبِقَلْبِهِ وَذلكَ أضعَفُ الايمان)[15]

(هەركام لەئێوە ناشەرعی‌یەكی بینی با بەدەست بیگۆڕێت جا ئەگەر نەیتوانی با بەزمان بیگۆڕێت، وە ئەگەر نەیتوانی بابەدڵ پێی ناخۆش بێت كە ئەوە لاوازترینی پلەی ئیمانە) وەك لەم فەرموودەیە دەفامرێتەوە بۆ گۆڕینی خراپەو ناشەرعیی دەبێ ناشەرعی‌یەكە بینراو بێت نەك بەجاسوسی كردن پێی بزانێت! وە دەبێ ناشەرعی‌یەكە بڕێنرابێتەوە كە ناشەرعیە نەك (خِلاف)ی لەسەر بێت، وە گۆڕینی ئەو ناشەرعیەش پلەو بەپلەیە كەسەرەتا بەدەستە پاشتر بەزمان پاشتر پێناخۆش بوونە بەدڵ.

وە دەبێ ئاگامان لەوە بێت كەسزا و سنوورە شەرعیەكان پێویستە لای دادوەرو قاضیو لەدادگا ئەو مەسەلانە جێبەجێبكرێن، نەك بە ئارەزووی خۆمانو بەبێ لێكۆڵینەوەو ساغ كردنەوەو، وەدەبێ بزانین ئایا گۆڕینو نەهێشتنی ناشەرعی‌یەك نابێتە هۆی ناشەرعیەكی گەورەتر!!

---

[15] رواه مسلم (٤٦) و ابوداود (١١٢٠) و الترمذي (٢١٧٣) والنسائي (١١١/٨) وابن ماجة (٤٠١٣).

وەك ئەوەی جارێك (إبن تيمية) و هاوەڵانی بەڕێگایەكدا دەڕۆن و كۆمەڵێك لە تەتەرو مەغۆلەكان دەبینین كە شەراب دەخۆنەوەو هاوەڵەكانی دەڵێن با بڕۆین لێیان تێك بدەین و نەهێڵین شەراب بخۆنەوە، (إبن تيميـە)ش دەڵێت: لێیان بگەڕێن چونكە ئەگەر سەرخۆش نەبن دەڕۆن قەتڵ دەكەن و دزی دەكەن و فەسادی دەكەن، كەواتە: زیانی سەرخۆشبوونیان كەمترە لەهی سەرخۆش نەبوونیان، بۆیە مەیخواردنەوەكەیان لێ تێك مەدەن!

## ١١-نەبوونی دەمارگیریی و حیزبگەرایی (التَعصُّب والتَحزُّب):

دەبێ ئاگامان لەخۆمان بێت و نەڵێین: حەق تەنها لەسەر ئێمە تاپۆ كراوەو كەسێك لەدەرەوەی بازنەی ئێمە بێت مسوڵمانێتییەكەی تەواو نییە بەپێچەوانەوە ڕەنگە كەسانێك هەبن كە لە دەرەوەی بازنەی كۆمەڵی بازنەی ئێمە بن بەڵام لەئێمە باشترو خواناسترین و بەتەئكید كەسانی واش هەر هەن!

بەڵێ با هەوڵبدەین دەمارگیریی و حیزبگەراییمان نەبێت و ڕێز لەكاری خەڵكانی تر بگرین چ حیزبی بێت یان ناحیزبی، بۆ وێنە: كەسایەتی و پیاو ماقوڵ و زاناو مامۆستایەك بێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَلا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَائَهُمْ) الشعراء: ١٨٣. واتە: (شتی خەڵك بەكەم مەگرن و بەچاوی سوك تەماشای مەكەن).

ئەگەر كەسێك ئیشی خۆی پێ لەهی كەسانیتر باشتر بێت با بەكردارو بەرهەم پێشانی بدات نەك بەگوفتار، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ) فصلت: ٣٣، واتە: (قسەی كێ لەهی ئەو كەسە باشترە كەبانگەواز دەكا بۆ لای خواو كردەوەی باش دەكا ودەڵێ من لە مسوڵمانانم ) كەواتە دەبێت ئێمەش بڵێین ئێمە لە مسوڵمانانین و لافو ئیدیعای ئیمتیازو زیادی لێنەدەین .

## ١٢-سوپاسگوزاریی بەرامبەر بە بەخششەکانی پەروەردگارو لەخۆبایی نەبوون:

کاتێك خوای گەورە بەخشش و نیعمەتێك بەکەسێکمان یان کۆمەڵەکەمان دەبەخشێت دەبێت لەبەرامبەری‌دا بەوەفاو ئەمەگ بین‌و سوپاسی خوای پەروەردگاری لەسەر بکەین، سوپاسکردنیش دوو شێوەیە:

١-(حَمْد): بریتیە لەمەدح‌و ستایشی خوا کەبەدڵ‌و بەدەم دەردەبڕێت.

٢-(شُکْر): بریتیە لە سوپاسگوزاریی پەروەردگار کە بەدڵ بوونی بەخششەکان لەخوای بالاّ دەست بزانین‌و بەزمان دانی پێدا بنێین، وە بە کردەوەش ئەو نیعمەتە لەپێناوی ڕەزامەندی خوادا بەکاربهێنین، واتە: ئەگەر نیعمەتەکە زانستە بۆ خوا بلاّوی بکەوە، ئەگەر عەقڵە بەکاری بهێنە بۆ ئیسلام، ئەگەر ماڵە بیبەخشە لەپێناوی خوادا، خوای گەورە دەفەرموێ: (اعْمَلُوا آلَ دَاوُدَ شُكْرًا) السبا: ١٣، واتە: (ئەی ئالی داود سوپاسگوزاریی ئەنجام بدەن) کەواتە: (حَمْد) بەزبانەو (شُکر) بەکردەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ) ابراهيم: ٧.

واتە: (ئەگەر سوپاسگوزاریم بکەن بۆتان زیاد دەکەم).

بێگومان زانست بۆ خزمەتی ئیسلام بلاّوبکرێتەوە زیاد دەکات، عەقڵ بۆ خزمەتی ئیسلام‌و مسوڵمانان بەکاربهێنرێ زیاد دەکات، ماڵ ئەگەر لەپێناوی خوادا ببەخشرێ بەرەکەتی تێدەکەوێ‌و زیاد دەکات.

وە دەبێ لەبەرامبەر خەلاّت‌و نیعمەتەکانی خوای گەورەدا تووشی لەخۆبایی بوون (غرور) نەبین‌و لەبەرامبەر نارەحەتی‌و گرفتەکاندا خۆڕاگربین‌و نەڕووخێین‌و تووشی بێئومێدیی نەبین، چونکە کەس نی‌یە لەژیاندا تووشی خۆشی‌و ناهەمواریی نەیەت، دەبێ لەکاتی ناهەمواریدا داوا لەخوا بکەین کە ئارامی‌مان پێببەخشێ‌و بتوانین نەدۆڕێین‌و لەکاتی

خۆشی و کامەرانیدا سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بکەین و لەخوای بەخشندەمان بپاڕێینەوە کە لەسەر ئەو سوپاس و ستایشە بەردەوام بین، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ) الحدید: ٢٣، واتە: (ئەوەمان بۆ ڕوونکردنەوە تاکو ئەگەر نیعمەتێکتان لەدەست چوو زۆر دڵگران نەبن وە ئەگەر نیعمەتێکتان هاتە دەست پێی لەخۆبایی نەبن چونکە خوای پەروەدگار هیچ کەسێکی فیزکەرو لەخۆباییبوی خۆش ناوێ).

هەروەها فەرموویەتی: (وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ) ابراهیم: ٧، واتە: (ئەگەر سپڵەیی و ناسوپاسیی بکەن سزای من زۆر توندەو نیعمەتەکەتان لێ دەسێنمەوەو لەجیاتی ئەوە بەڵاو ناڕەحەتیتان بۆ دەنێرم)

لەکۆتایدا دەڵێم با بەپشتیوانی خوا بەهەرشێوەیەك بووە هەوڵبدەین کەچاکە لەگەڵ خەڵکی بکەین و لەزیان پێگەیاندنیان بەدوور بین، دەست و دەم و کردار پاك بین ئەوەی بۆ خۆمان پێمان ناخۆشە بۆ بەرامبەرو خەڵکانی دەوروبەر پێمان ناخۆش بێت وە ئەوەی بۆ خۆمان پێمان خۆشە بۆ خەڵکانیتریش پێمان خۆش بێت و وریابین و دڵی هیچ کەسێك زویر نەکەین لەخۆمان و نەیان ڕەنجێنین.

پێویستە ئاماژە بەشەهامەت و چاکەکاریی خەڵکی ئەم ناوچانەش (هەورامان - شارەزوور) بەتایبەتی بکەین کەچەند ساڵە زەحمەتیان پێوەکێشاوین و ، خوا یاربێت دەبێ هەوڵ بدەین هەرچی لەتواناماندایە بۆیانی بکەین و زیانەکانیان بۆ قەرەبوو بکەینەوە وەك کۆمەڵی ئیسلامی چونکە لەسەر ئێمە باجیان داوەو ڕەنگە لەزۆر شت بێبەش کرابن و بەهۆی شەڕو شۆڕی پێشووەوە زیانیان لێکەوتووە. خوایە لێمان ڕازی بیت و سەرفرازمان بکەیت.

وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه أجمعین والحمدلله رب العالمین،

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

## نێوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشکەش بێ | ٢ |
| ووتەی راگەیاندن | ٣ |
| ئەم نامیلکەیە | ٤ |
| دەقی ووتارەکە | ٦ |
| خاڵی یەکەم: قسەکردن‌و ووتوێژ لەگەڵ خەڵکدا بەشێوەیەکی شەرعیانە، وە خۆپاراستن لەهەر ووشەو قسەیەکی دڵبریندارکەرو رووشێنەرو بێنەزاکەت. | ١٢ |
| خاڵی دووەم: چۆنیەتی رەفتارکردنمان لەکۆڕو مەجلیسدا. | ١٤ |
| خاڵی سێیەم: بەڕێگادا رۆیشتن بەسواری یان پیادە. | ١٥ |
| خاڵی چوارەم: چۆنیەتی رەفتارکردن لەگەڵ کەسانی لەخۆ گەورەترو لەخۆ بچوکتردا. | ١٦ |
| خاڵی پێنجەم: چۆنیەتی رەفتارکردن لەکاتی بەرەنگاری‌و رووبەڕووبونەوەی نەزانین‌و نەفامی کەسانی نەفام‌و ناکامڵدا. | ١٨ |
| خاڵی شەشەم: ڕێزگرتن لەمیوان‌و لەڕێبوار. | ٢٠ |
| خاڵی حەوتەم: رووگەشی‌و زمان شیرینی‌و بەڕێزی لەگەڵ خەڵکدا | ٢١ |
| خاڵی هەشتەم: مامەڵەکردن‌و کرین‌و فرۆشتن. | ٢٢ |
| خاڵی نۆیەم: سینگفراوانی‌و چاوپۆشیکردن لەبەرامبەر رەخنەو توانج‌و تێبینی خەڵکدا. | ٢٢ |
| خاڵی دەیەم: خەڵك بانگکردن بۆ ئیسلام‌و فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە دەبێ لەسەر بناغەی بنەما شەرعیەکان بن. | ٢٤ |
| خاڵی یازدەیەم: نەبوونی دەمارگیری‌و حیزبگەرایی. | ٢٥ |
| خاڵی دوازدەیەم: سوپاسگوزاریی بەرامبەر بە بەخششەکانی پەروەردگارو لەخۆبایی نەبوون. | ٢٦ |

